جیهانێکی هەمەڕەنگ

De Kleuren Tovenaar
Arnold Lobel
Marjo Keizer
فاتمە عومەر ڕێشاوی
2005سیتارد

لە هۆلەندیەوە بە دەستکاریەوە وەرگێڕراوە



جارێک لە جاران لە ڕۆژگارێکی زۆر  دووردا جیهان هیچ ڕەنگێکی نەبوو  زۆربەی شتەکان ڕەنگی خۆڵەمێشی هەبوو .
ئەوەیش خۆڵەمێشی نەبوو یان  ڕەش یان سپی بوو ئەو کات کاتی ڕەش و سپی  بوو.....

خەڵکی وورده وورده بێزاریان تێدا دەرئەکەوت بەلام نەیاندەزانی چی بکەن !!
هەر چۆن بێ لەم لا و لاوه دەنگی بێزاری به هێواشی دەبیسترا



ئەو جادووگەرەی  کە لەو کاتەدا دەژیا، هەموو بەیانیەک لەبەردەم پەنجەرەکەیدا دەوەستا و  لەوێوە چاوێکی بە وولاتەکەیدا دەخشاند و لەبەرخۆیەوە دەیووت :

((ئەم جیهانە لە  شتێکی  گەورەدا کورتبڕی هەیە. هیچ کاتێ نازانی کەی هەتاو هەڵدێ و کەی ئاوا دەبێ. کەی   باران دەبێ و کەی ئاسمان سامال دەبێ...




ئەمەی دەوت و  بە قادرمە ڕەش وسپییەکانیدا بەرەو ژێرزەمینە ڕەش وسپییەکەیدا دەچووە خوارەوە  لەوێدا خۆی خەریک دەکرد بەجادووکردنەوە.

لە وێدا هیچ نەبێ ئەو جیهانە ڕەش و  سپییەی  بیردەچوە و  بێزاری خۆی دەردەکرد.
تا ڕۆژێکیان هەموو ئەو ماددە شلانەی کە هەیبو و جادووی  پێدەکرد، تۆزێ لەم و تۆزێ لەوی  بەسەر یەکدا  کرد و دەستی کرد بە تێکدان و تێکەڵ کردنیان.



لە ناکاو لە بنی قازانگەکەیدا شلەیەکی زۆرسەیر کە ڕەنگێکی جیاوازی لە جیهانی دەرەوە هەبوو، بەرچاو کەوت.
لە خۆشیدا هاواریکرد : ئای چ شتێکی جوانم دروستکرد . ئەبێ هەر ئێستە زیاتری لێ دروست بکەم.



جادووگەرەکە  کارەکەی خۆی ئەنجام دا و دەستی کرد بە  بۆیەکردنی مالەکەی لەو کاتەدا  دراوسێکانی بینیان لێیان پرسی:
((ئەمە چیە ؟؟))



ئەویش  بە سەر پەیژەکەیەوە لە سەر ئیشەکەی خۆی بەردەوام بوو و وەلامی دا نەوە ئەوە
پێی دەلێن (( ڕەنگ، ڕەنگی شین))
ئەوانیش دەست بەجێ دلیان بەو ڕەنگە کرایەوە و حەزیان لێکرد ووتیان: (( بە یارمەتیت ئەتوانین بەکاری بهێنین؟؟))
جادووگەرەکە وەلامی دا نەوە (( بێگومان، هی ترتان بۆدروست دەکەم تا هەمووتان بتوانن بەکاربهێن))



خەڵکی دەستیان کرد بە ڕەنگ کردنی شتەکانیان بەو شێوەیە کاتی شین پەیدا بوو. لە ماوەیەکی زۆر کورتتدا جیهان ڕەنگی شینی پۆشی ..

درەختەکان شین بوون ...دەشت و شاخەکان ، خواردن، شتومەکی ناومال، جلوبەرگ و بالندە و مەڕو مالات. ئاسمان و ڕووبارەکان ، چەم و دۆلەکان لە شین هەلکێشرابوون.





جادووگەرەکەش بە سوا ری پاسکیلە شینەکەی بە چواردەوری ئەو جیهانە لە شین هەلکێشراوەدا دەسورا یەوە، لەبەر خۆیەوە دەیوت: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکی خۆشە.. سەیرکەن چەن دلی ئەو خەلکەم خۆش کرد بە ڕا ستی کارێکی چاکم ئەنجام داوە.

بەلام هەر ماوەیەکی خایاند ئەو جیهانە شین و گەورەیە لە ناکاو خۆشی تێدا نەما. کەس نەبوو لە و جیهانەدا دلخۆش بێ . هەموو خەفەت دایگرتن.

منالان یاریان نەدەکرد.. دا یک و باوکەکان دانیشتوون بە مات ومەلولی سەیری حەوشە و مال و ژوورە شینەکانیان دەکرد، کەس ئارەزووی هیچی نەما بوو. نەشیاندەزا نی چی بکەن.
دراوسێکان چوونەوە لای ساحیرەکە و پێیان ووت:
بەرێز، ئەم ڕەنگە شینە زۆر خەفەتاویە. هیچ کەس هەست بە بەختەوەری ناکات..

ئەویش ووتی:(( ئێوە ڕا ست دەکەن کەس ڕووی خۆش نیە ؟ تەنانەت خۆشم ئەوە چەند ڕۆژێکە پێکەنین و زەردەخەنە نەکەوتۆتە سەر دەموچاووم. ئەبێ شتێکی تر دروست بکەم))

ئەمەی ووت و بە قادرمە شینەکانیدا بەرەو ژێرزەمینە شینەکەی چوە خوارەوە و دەستی کردوە بەکارکردن، تۆزێ لەمە و تۆزێ لەوەی تێکەل دەکرد و تێکی دەدان. لە ناکاو لە بنی قازا نگەکەیدا شتێکی سەیری بینی کە لەوەی پێشوو نەدەچوو..

ساحیرەکە دلی خۆش بوو ووتی: (( ئەمەتا ئەمەیە شتێکی دلخۆشکەر. هەر ئێستا زۆری دەکەم..))





جادووگەرەکە دوای ئەوەی کارەکەی ئەنجامدا
دەستی کرد بە بۆیە کردنی پەرژینی مالەکەی. لەو کاتەدا دراوسێکانی هاتن پرسیان: ((ئەمەیان چیە مام جادووگەر؟؟)) وەلامی دانەوە(( ئەوە من ناووم ناوە ڕەنگی زەرد))



دراوسێکان دیسانەوە سەرسام بوون و حەزیان لێکرد ووتیان: (( ئەی ئێمەش ئەتوانین بەکاربهێنین
ئەویش ووتی :(( ئەی بۆ نا، سبەینێ ئەم کاتە وەرنەوە هەر کەس بەشی خۆی وەرگرێ ))



خەلکی دەستیان کرد بە بۆیەکردنی شتەکانیان
بەم شێوەیە کاتی زەرد دەستی پێکرد. لە ماوەیەکی کورتتدا هەموو جیهان زەرد بوو. یەک بست شین بەدەرەوە نەما درەختەکان زەرد بوون ...دەشت و شاخەکان، خواردن، شتومەکی ناومال، جلوبەرگ و بالندە و مەڕو مالات لە زەرد هەلکێشرابوون.



جادووگەرەکە ئەم جارە بە ئەسپە زەردەکەی بە دەوری ئەو جیهانە لە زەرد هەلکێشراوەدا دەسوڕا یەوە و لەبەر خۆیەوە دەیووت: ((چەند لەم ڕۆژە ڕازیم و شوکرانی خوا دەکەم))
خەلکیش دەستخۆشیان لە ساحیرەکە دەکرد و سوپاسگوزاری بوون.
هەموو بە خۆشیەوە خەرکی کارو باری خۆیان بوون.

بەلام ئەمەش زۆری نەخایاند، ئەو ڕەگە زەردە هەموویانی توشی ژا نە سەر کرد، چاوەکانیان خێل بوو، لەکاتی ڕۆشتندا بەم دیو ئەودیوا دەکەوتن و خۆیان بەیەکتردا دەکێشا.



هەرچیەکیان تاقیکردەوە بۆ ئەوەی چارەیان بکات هەر بێ سوود بوو.

کەس هۆکاری ئەمەی نەدەزانی .. تا گەنجێکی هۆشیاریان تێدا هەڵکەوت. ووتی :(( ئەم ڕەنگە زەردەیە ئێمەی نەخۆش خستوە، خەریکە کوێرمان دەکات. با بچینەوە بۆ لای کابرای جادووگەر بەلکو ڕێگە چارەیەکی لا بێ.

ئەوان لەسەرەتادا باوەڕیان پێنەدەکرد و گاڵتەیان پێدەهات. بەلام هەرچۆن بوو لە کۆتاییدا. ڕێکەوتن لەگەل ئەو گەنجەدا چوونە لای کابرا ، بینیان ئەویش لە جێگەکەیدا ڕا کشاوە و خاولیەکی تەڕی لەسەر و ناوچەوانی داناوە ئەویش وەکو ئەوان سەری ژان دەکرد.



کابرای جادووگەر سەرە ڕای نەخۆشیەکەی بەڵێنی دا بە خەڵکەکە کە هەوڵی چارەیەکیان بۆ دەدا.

بۆیە هەرچۆن بوو لە ناو جێگەکەی هەستاو بە قادرمە زەردەکاندا دابەزی بۆ ژێرزەمینە زەردەکەی. لەوێدا دەستی کردەوە بە تێکەڵ کردن و تێکدان.. تۆزێ لەمە و تۆزێ لەوە. ئەمجارەش شتێکی تر کە لەوانی تر نەئەچوو لە بنی قازانگەکەیدا دروست بوو.





جادووگەر ئەمجارەش گورج بوویەوە و دەستی کرد بە بۆیە کردنی گولە کانی.
لەو کاتەدا دراوسێکانی گەڕانەوە بۆ لای بینیان ی‌ەگێکی تر بە دەستەوەیە پرسیان: (( ئەی ئەمە ناوی چیە؟))
ئەویش بێ ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە ووتی: (( ئەمەیان بێی دەڵێین سوور، ڕەنگی سوور))
ئەوانیش دیسانەوە داوایان لێکرد کە بەشی ئەوا نیش بدات. چونکە زۆریان پێویستە تا لەو حالە ڕزگاریان بێت. جادووگەرەکە دەست بە جێ داواکە جێبەجێ کردن.



خەلکەکە هەرچیان هەبوو نەبوو بە سوور ڕەنگیان کرد یەک بست شین یان زەرد بەدەرەو ە نەما..
بەم شێوەیە کاتی جیهانی سوور هاتە کایەوە. لە ماوەیەکی کورتتدا جیهان بەرگی سووری پۆشی ..
درەختەکان سوور بوون... ئاوو تاڤگە و فوارەکان دەشت و شاخەکان، خواردن، شتومەکی ناومال، جلوبەرگ و بالندە و مەرو مالات ڕووبار و چەمەکان لەسوور هەلکێشرابوون.

جادووگەر ئەمجارەیان بە بەلەمە سوورەکەی بە دەوری ئەو جیهانە سوورەدا سووڕایەوە و گۆرانی دەووهەلدەپەڕی و سلاوی لە لە گەورە و بچوک دەکرد ئەوا نیش بە خۆشی و ر ەزامەندیەوە سلاوەکەیان بۆ ئەسندەوە.



ئەمە هەر ماوەیەکی خایاند. ئەم ڕەنگەش دادی نەیان.
خەلکی تووشی تورە و هەلچوون بوون . منالان هەتا دەهات هەر شەڕیان دەکرد و لەیەکتریان ئەدا.
دایک و باوکان هەموو رۆژێ شەریان دەبوو.
دراوسێکان بە تووڕەییەوە چوون بۆ جادووگەرەکە و بەرد بارانیان دەکرد و هاواریان کرد بەسەریدا : ((ئەم ڕەنگە سوورە شەڕانگێزە، کاری تۆیە. هەر ئێستا ئێرە بە جێ بهێلە..
ئەگینا بەرد بارانت دەکەین))
جادووگەرەکەو هەر چۆن بێ ماوەیەک خۆی لێیان شاردەوە.

بەلام  بە ناچاری دیسانەوە خۆی کردەوە بە ژێرزەمینە سوورەکەیدا.



شەو و ڕۆژی خستە سەر یەک هەرچی کتێبی سالەکانی تر بوو سەر لەنوێ پێدا چووەوە  هەرچی هەبوو لە مادده شلەکان بەکاری هێنا ، هەرچی هێز و ئەقلی هەبوو خستیە کار بەلام ئەوەی.
دەرەچوو شین یان زەرد یان سوور بوو.

بەلام جادووگەرەکە کۆلی نەدا بەلام هەرتێکی دان هەر تێکیدان هەتا هەموو  قازا نگەکانی پڕبوون لەو سێ ڕەنگە کەوت و سەروگێولاکی خۆی تێنا.. بەلام هەر سەرنجی بۆیە تێکەلاوەکانی دەدا..

ئەوەندە پڕبوون لێیان دەڕژا .. شین و زەرد و سوور تێکەل بوو بوون . یەک بستی ژێرزەمینەکەی  بەدەرەوە نەمابوو  هەمووی لەو سێ ڕەنگە هەلکێشرا بوو.
جادووگەرەکە پەکی  کەوت نەیتوا نی لەوە زیاتر ئیش بکات لە ناو ئەو ڕەنگانەدا



دوای ئەوەی دەستی لە کار هەڵگرت و ماوەیەک پشووی دا لە ناکاودا دۆزیەوە. شتێک هات بە خەیالیدا،

ئەو سێ ڕەنگە هەر جارەو دوانیان تێکەڵ بەیەک بکات بەڵکو شتێکی تازەی لێدەرچێت بەڵێ ئەوەی ئەو بۆی دەگەڕا ئەمە بوو..
ئەمەیە ڕێگە چارە هەمووگرفتەکان..
هەناسەیەکی هەڵکێشا ووتی دەستی کردوە بە ئیش کردن.

ڕەنگی سوور و شینی تێکەڵ کرد .ڕەنگێکی تری لێدروست بوو. ئەویش ڕەنگی مۆر بوو..



ڕەنگی زەرد و شینی و تێکەڵ کرد .ڕەنگێکی تری لێدروست بوو. ئەویش  ڕەنگی سەوز بوو..



ڕەنگی زەرد و سووری  و تێکەڵ کرد .ڕەنگێکی تری لێدروست بوو. ئەویش ڕەنگی پرتەقالی بوو..



هەر بەم شێوەیە هەر جارەو دوو ڕەنگی تێکەڵ دەکرد و جوان تێکی دەدا، ڕەنگێکی تری بۆ دەرئەچوو. تا بەو شێوەیە چەند ڕەنگێکی جیاوازی دروست کرد.



دوای ئەوەی ئەم کارەی ئەنجامدا چووە دەرەوە دراوسێکانی کۆکردەوە ووتی : وەرن بزانن چیم دروست کردوە دراوسێکانی چاویان بەو هەموو ڕەنگانە کەوت زۆر سەرسام بوو بوون، هەموو یان بەلاوە جوان بوتەنانەت ڕەنگە کۆنەکانیش. بەلام نەیاندەزانی کامیان لەو ڕەنگانە هەلبژێرن.
جادووگەرەکە هاتە پێشەوە لێیان ووتی:

((ئێوە پێویستان بەهەموو ڕەنگەکان دەبێ)) بۆیە دەبێ هەر هەمووی بەکار نەهێنن و بیناسن.
بۆ هەریەکەشیان ناوێکم دا ناوە سەوز، مۆر، پرتەقالی.

خەڵکی پۆل پۆل دەهاتن ڕەنگەکانیان دەبرد و هەر شتێک بە ڕەنگێک بۆیەیان دەکرد.



هەموو بەیانیەک جادووگەرەکە پەنجەرەکەی دەکردەوە و سەیرێکی دەرەوەی ئەکرد لە بەر خۆیەوە ئەیوت: ئەمرۆ چەند رۆژێکی خۆش و جوان و هەمەڕەنگە.



دراوسێکانیش سێوی سوور و مۆزی زەرد و ترێی مۆر و گەلاو گولی سەوز و هەمە ڕەنگیان بۆ دەهێنا و سوپاسیان دەکرد.